# مشکه

لە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

ئاراس

دەردەچێت

مشکە بۆ تەمەنی ٩ تا ١٤ ساڵانە




باسەرە
زاری کرمانجی


خاوەنی ئیمتیاز
**بەدران ئەحمەد حەبیب**

سەرنووسیار
**ئەمیر حاجی داود**

راوێژکار
**رێواس ئەحمەد**

بەڕێوەبەری نووسیاری
**رەهێڵ رەشید**

سەرپەرشتیاری هونەری و نەخشەسازی
**گەیلان عەبدوڵڵا**
٤٦٧٥٦٠٧

دەستەی نووسیاری
**هەوار شەریف**
**داستان کاکەساڵح**
**شنە سەدیق**
**زارا ئەحمەد**

هەڵەگری
**شێرزاد فەقێ ئیسماعیل**

ژمارە ٤٣ تشرینی یەکەم ٢٠٠٩



دەتوانن بابەتەکانتان بەم ناونیشانە بۆ ئێمە رەوانە بکەن
هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس ـ شەقامی گوڵان
لەرێی (بۆتان جەوهەر)ەوە بابەتەکانتان رەوانە بکەن.
سەنتەری لاوانی میدیا بۆ رۆشنبیری و هونەر و راگەیاندن ـ گەڕەکی کوران
کەرکووك ـ دەزگای رۆشنبیری شەفەق
سۆران ـ دەزگای زاری کرمانجی بۆ رۆشنبیری و هونەر و راگەیاندن
یان لەرێگای پۆستی ئەلیکترۆنی
E.mail: mshka _ mag@yahoo.com
E.mail: gaylanart@yahoo.com






# مام ڕێوی پینەدۆز

نووسینی : زاهیر ئیسماعیل گەردی
وێنە : پەروەر

مام ڕێوی لەسەر گردێك هەندێك چەرمە پێلاوی کۆکردەوە و مام گورگ بە لایدا تێپەڕبوو. لە مام ڕێوی پرسی:

ـ ئەوە لێرە چی دەکەی؟ مام ڕێوی نەتزانییە من پینەدۆزی دەکەم، فەروەی لە پێستی چەوری گۆشتی کاوڕی قەڵەو دروست دەکەم؟

ـ مام گورگ ئەدی ئەو چەرمە چییە لە دەوری خۆت کۆکردووەتەوە؟!

ـ مام ڕێوی ئەو زستانە ساردە دەمەوێ فەروەیەك بۆ خۆم دروست بکەم... مام گورگ بڕوای کرد گوتی:

ـ ئەرێ بە چەند کاوڕ فەروەیەك دەکەی؟

ـ مام ڕێوی بە بیست کاوڕی قەڵەو دابەستێ، نەك نەخۆشی و لەڕو لاواز.

ـ باشە ئەوە بە چەند ڕۆژ تەواو دەبی؟

ـ ئەوە سی ڕۆژ دەخایەنێت نابێ لە کونێ بێمە دەرێ دەبێ بەخۆت بۆم بێی لەبەر دەرگای کونەکەم دابنێیی بە کەس نەڵێی و ئەوە تایبەتە بۆ گەورەی بەڕێزم.

ـ زۆر سوپاست دەکەم ئەو ماندووبوونەت لەبیر ناکەم و منیش کاوڕت بۆ دێنم.

مام گورگ کاوڕی قەڵە و قەڵەوی دەهێنا و مام ڕێوی لە کونێ دەیخوارد تاکو سی ڕۆژ تەواو مام گورگ چاوی بە مام ڕێوی نەکەوت و فەروەشی بۆ دروست نەکرد. مام گورگ بۆی دەرکەوت ڕێوی فێڵبازە و هەڵی خەڵەتاندووە و فێڵی لێکردووە. مام گورگ بڕیاری دا تۆڵەی لێ بکاتەوە، ئەو ژەمەی هێنابووی بۆ مام ڕێوی فڕێدا بوو بەتێلێك لەبەر دەرگای کونی مام ڕێوی هەڵیواسی.



مام ڕێوی چەند ڕۆژێك لە کونێ مایەوە، برسی بوو. گوێی لە دەنگی ورشە ورشەی با و باران بوو.
کە هاتە دەرەوە چەرمەکەی دێت و مام ڕێوی وای ئەزانی مام گورگ کونی لێگرتبووە.
پاشان مام ڕێوی خەریك بوو لە برسان بمری، لە برسان لە کونێ دەرپەڕی و هاتە دەرێ.
خۆی لە چەرمەکی داو لێی دوورکەوتەوە. پاشان ترسی گورگی لەسەر نەما و لە چەرمەکەی نزیك بووەوە و چەرمەکەی هەمووی خوارد.
پێشینان ڕاستیان وتووە (زگی برسی لە هیچ ناپرسی). چووە سەر گردێك نزیك کانی ژنان لەوێ ئاویان لێ دەبرد بۆ ئاو خواردنەوە. مام گورگ لە دوورەوە دیتی مام ڕێوی لەسەر گردێکە، لێی نزیك بووەوە و پێی گوت ها مام ڕێوی لێرە چ دەکەی ئەدی پینەدۆزیت نەدەکرد کوانێ فەروەکەم؟
مام ڕێوی گوتی من لە ژیانمدا قەفەزم دروست کردووە لە باب و باپیرانم بۆمن مایتەوە.
مام گورگ گوتی کوانێ قەفەز؟ مام ڕێوی ئەوەتە قەفەزم دروست کردووە فەرموو برۆ ژوورێ.
مام گورگ چووە ژوورێ تەڵەیەکی تێدابوو تەقی دەرگا لە مام گورگ قەپات بوو، سەگ و توولە و خاوەن تەڵەکە هاتن مام گورگیان گرت هەندییان لێدا تاکو مام گورگ مرد. مام ڕێوی هەڵات و سەلامەت مایەوە.



# چۆلەکەیەکی ڕەنگاوڕەنگ!

نووسینی : شەماڵ نەوڕۆلی
سکێچ : شێروان موحسین

ڕۆژێك لە ڕۆژان چۆلەکەیەك لەناو هێلانەکەی دا لەتاو ماندوێتی نەیدەزانی چی بکات، پێڵوی چاوەکانی هەر دەکرانەوەو دادەخرانەوە. چۆلەکە ئەو ڕۆژە هێندە بەئاسماندا فڕی بوو، کە بەتەواوەتی شەکەت ببوو. گەلێك خەیاڵی سەیر سەیری بەمێشکیدا دەهات، لەناکاوێکدا بینی وا کەوتۆتە نێوان کۆمەڵێك باڵندەی ڕەنگاوڕەنگەوە، باڵندەکان لە جوانیدا بێ وێنە بوون! ڕەنگی پەڕەکانیان بە ڕەنگانی پەلکەزێڕینە دەچوو.

چۆلەکەکە گەلێك سەری سوڕما بوو، حەزی دەکرد هەر لەناویاندا بمێنێتەوە، بۆیە بە یەکێك لە باڵندەکانی گوت: دەتوانم ببم بە هاوڕێی ئێوە؟

- بەڵێ بێگومان، خۆ تۆش وەکو ئێمە باڵندەی.
- بەڵام ڕەنگی من لە ئێوە جیاوازە.
- نەخێر تۆش هەر هەمان ڕەنگی ئێمەت هەیە.

کاتێك کە چۆلەکەکە سەیری پەڕەکانی خۆی کرد بینی هەموو پەڕەکانی وەکو باڵندەکانی دی ڕەنگاوڕەنگە.

چۆلەکەکە لەخۆشیاندا نەیدەزانی چی بکات، دەیویست خۆی نیشانی هەموو باڵندەکان بدات، بۆیە لە هیچ جێیەك ئۆقرەی نەدەگرت، لەسەر ئەم درەختەوە بۆ سەر درەختێکی دی دەفڕی.

لەکاتێکدا چۆلەکەکە لەسەر لقی درەختێك نیشتبۆوە، منداڵێك بەردێکی تێگرت، خەریك بوو چۆلەکەکە بپێکێ.

چۆلەکەکە لەترساندا هەڵفڕی بۆ سەر لقی درەختێکی تر.

منداڵەکە بەدوای چۆلەکەکەدا ڕای کرد. لەوکاتەدا منداڵەکە بە هاوڕێیەکەی گوت: من هەرگیز چۆلەکەی ئاسایی ناکەم بە نێچیر، بەڵام ئەم چۆلەکە ڕەنگاوڕەنگە هەرددەبێ بگرم.

دیسان منداڵەکە بەردێکی تری تێگرت، ئەمجارەیان چۆلەکەکە باڵێکی بریندار بوو، لەسەر لقی درەختەکە کەوتە خوارەوە. کاتێك کە منداڵەکە بەرەو لای دەهات، چۆلەکە بەستەزمانەکە نەیدەزانی چۆن خۆی ڕزگار بکات، چونکە هیچ توانای فڕینی نەما بوو.



لەناکاوێکدا چۆلەکەکە بەئاگا هاتەوەو بینی هێشتا هەر لەناو هێلانەکەیدایە، نە بریندار بووە و نە باڵەکانی ڕەنگاوڕەنگە، بەڵکو ئەوەی کە ڕووی داوە هەر خەون بووە. لەگەڵ ئەوەشدا چۆلەکەکە بە پەشۆکاوییەکەوە بەخۆی وت: حەز دەکەم هەمیشە وەکو خۆم بمێنمەوەو پەڕەکانم ڕەنگاوڕەنگ نەبێت، بۆ ئەوەی بتوانم بە ئازادی لە هەموو جێیەکدا بفڕم.



# شەڕی ڕەنگەکان

نووسینی: ئاوات ئەنوەر
سکێچ: شێروان موحسین

بەیانییەك هێشتا زوو بوو. بەڵام فڵچەی ڕەنگەکان لە دەنگە دەنگ خەبەری بووەوەو هەڵسا. پرچە ڕەشەکەی هەڵدایەوە سەیری کرد دەنگی ڕەنگەکانە شەر دەکەن.

فڵچەکە وتی: جارێ زۆر زووە، بۆ هەڵساون ئەمە شەڕتان لە چییە؟

ڕەنگی سوور کە زۆر تووڕە بوو وتی: وەڵام بدەوە ئەی فڵچەی گشت ڕەنگەکان. هەر من نیم کە ئەتوانم ڕەنگی خوێنی شەهیدان نیشان بدەم. هەروەها من ڕەنگی گوڵی سوور و گرم. کەواتە من پاشای ڕەنگەکانم. فڵچەکە گوێی لە قاقای ڕەنگی چین بوو کە دەیگوت: وش بە ئەی ڕەنگی سوور ئەگەر نا ئاگرەکەت دەکوژێنمەوە بە ئاوەکەم چونکە من دەریا و زەریام. من ئاسمانم. کەواتە من پاشای ڕەنگەکانم. ڕەنگی زەرد قسەی کرد بەدەنگێکی بەرز وتی: با هەمووتان بزانن من نیشانەی دوو شتی زۆر بەنرخ و بە بەهام (ئاڵتون و خۆر) واتە من پاشای ڕەنگەکانم. ڕەنگی سەوز قسەی بە ڕەنگی زەرد بڕی وتی: پێم بڵێن گەر درەخت و چیا و دەشت سەوز نابێ، ژیان ژ سوودێکی هەیە. دەی تاجی پاشایەتی بدەن بە من. بەهەمان شێوە فڵچە کە گوێی لە هەموو ڕەنگەکانی تر گرت تا هەموویان قسەیان کرد ئینجا فڵچەکە سەری لەقاند و وتی ئێوە فێڵ لەخۆتان دەکەن. ئەی نەتان بیستووە چەپڵە بەیەك دەست لێنادرێ. بەرەو لای پەرداخە ئاوەکە ڕۆیشت و پرچی تەڕکرد و بەنەرمی لەناو ڕەنگی زەرد ناو تێکەڵی کرد تا بەتەواوی زەرد بوو ئینجا ڕووی کردە تەختە سپییە سادەکە و وێنەی بازنەیەکی کرد. پرسی ئەی ڕەنگەکان ئەم شێوەیە چییە. ڕەنگەکان بەبێ دەنگی سەیری شێوەکەیان دەکرد. فڵچەکە وتی: ئەمە شێوەی بازنەیەکی زەردە، دەیکەم بە خۆر بەڵام دەبێ ئاسمانێکی شینی بۆ دروست بکەم. ڕەنگەکان هەستیان بە شەرمەزاری کرد و داوایان کرد کە فڵچەکە هەموو ڕەنگەکان لە یەك وێنە کۆبکاتەوە. فڵچەکە پرچی لە ڕەنگی شین وەرداو ئاسمانێکی شینی بۆ بازنە زەردەکە دروست کرد و کردی بە ئاسمان و خۆر. هەروەها پرچی بە ڕەنگی سەوزدا کرد و وێنەی کۆمەڵێ درەخت و گیای کرد و هەروەها بە ڕەنگی سوور پرچی ڕەنگ کرد و گوڵی سووری کرد و بە هەمان شێوە پرچی لە ڕەنگەکانی تر وەردا و وێنەی شاخ و ئاو و مەل و بولبول و گوڵ و گوڵزاری کرد. فڵچەکە کە هەموو ڕەنگەکانی لە وێنەیەکدا کۆکردەوە بۆیە وێنەیەکی زۆر جوان و سەرنجراکێش دەرچوو. فڵچەکە دوای ئەوەی ئەم کێشەیەی بە وێنە چارەسەر کرد، ڕەنگەکانی زۆر دڵخۆش بوون و تێگەیشتن کە هەموو ڕەنگەکان گرنگن بۆ وێنەی ژیان بۆیە دەست خۆشیان لە فڵچەکە کرد و بەیەك دەنگ وتیان بژی فڵچەی پاشامان.... بژی فڵچەی پاشامان.



# بپرسە و مەترسە

**ئامادەکردنی: هەوار شەریف**




## PONYO

ئەم فیلم کارتۆنە کـۆمپانیای ئەنیمەیشنی یابانی دروستی کـــردوە، دەربارەی ماسیەکە لەشێوەی منداڵدایە وەك ماسی لەنێو ئاودا دەژی وبەهۆی ماسی گرە کانەوە دەکەوێتە سەرکـەناری دەریاکەو منداڵێکی بچووك دەیدۆزێتەوە ناوی (سوسکێیە) وماسییە بچووکـەکـە ناودەنێت (پۆینۆ) بەڵام جادووگـــەری نێو دەریا بەدوودا دێت و ماسییە بچووکەکە دەباتەوە، سوسکێ بەدیارنەمانی ئەو هاورێ بچووکـــە زۆرخەمبار دەبێت بەڵام ماسییە بچووکـەکـە دەیەوێت لەگەڵ ئەو منداڵەدا بمێنێتەوە، لەناکاو قاچو دەستی لێپەیدا دەبێت و وەك منداڵێك دەبێت.

جادووگەر تورە دەبێت و دەیکاتەوە بەماسی و لەنێو بڵقە ئاوێکدا دایدەنێت، ماسییە بچووکەکانی تر بڵقە ئاوەکـە دەتەقێنن و پۆینۆ دەچێتەوە بۆ لای سوسکێ منداڵەکە، پۆینۆ دەبێتە کیژێکی بچووکی جوان پێکەوە یاری دەکەن و سوسکـــێ پۆینۆ فێری شتی خۆش خۆش دەکات، بەڵام کـــاتێك پەری دەریا دێت پۆینۆ بباتەوە، سوسکێ داوا دەکـــات پۆینۆ لای بمێنێتەوەو جارێکــــی تر نەبێتەوە بەماسی، پەری دەریاش ڕازی دەبێت و پۆینۆ هەتا هەتایە دەبێتە هاورێی سوسکێ و هەرگیز نابێتەوە بەماسی.



# ICE AGE
## DAWN OF THE DINOSAURS
## JULY 2009

ئەم فیلمە بەشی سێیەمی فیلم کـــارتۆنی (چاخی بەستەڵەکـــە) کەفیلم کـــارتۆنێکی خۆشەو لەژمارەکانی تری ئەم گۆڤارەدا دووبەشەکەی ترمان باس کردوە، لەم فیلمەدا هاوڕێکان (مانی ودیگۆوئێلی) دەچن بۆ ڕزگارکـردنی (سید) کـــە سێ  هێلکـــەی دایناسۆری دۆزیبۆیەوەو دایکە دایناسۆرەکـــە بێچوەکـــانی دەباتەوەو سیدیش دەبات بۆ نێو دارستانی ترسناکی دایناسۆرەکان.

هاوڕێکان بەدووی سید دەگـــەڕێن لەوگەشتە ترسناکـــەشیان بۆنێو دایناسۆرەکان (بك) یارمەتیان ئەدات و تووشی ڕووداوی ترسناك دەبن ولەکۆتایدا دایکە دایناسۆرەکـە، دایناسۆرە ترسناکـــەکە لەناو دەبات و سید ڕزگـــاردەکـەن هاوکات (ئێلی) بێچوە فیلێکی بچوکی جوانی دەبێت کەناوی دەنێن (قۆخ).

ئەم فیلم کـــارتۆنە زۆرزۆرخۆشە باس لەیارمەتی و خۆشەویستانەی ئەو هاوڕێیانە دەکـــات کە هەرلەبەشی یەکەمی ئەم فیلمە هاوڕێن و یارمەتی یەکدی ئەدەن.

ئەم فیلمە بەرهەمی (فۆکسە) ولەدەرهێنانی (کارلۆس سالدینهاومیکی سۆرمەر)ە.



# پاسەپۆرت

ئامادەکردنی: نیڤار ڕێبین

پاسەپۆرت پەڵگەنامەیەکی فەرمییە بۆ گەشتکردن بۆ وڵاتانی تری جیهان بەکاردهێنرێت، ساڵانەش شیوەی گۆڕاوە تا گەیشتووەتە ئەم شێوەیەی ئێستا دەیبینین. چەند مەرجێکی گرنگ هەن بۆ ئەوەی پاسەپۆرتەکەت دروست بێت و لە وڵاتانی تری جیهان کاری پێبکرێت.

بۆیە ئەگەر بڕیاردا گەشت بۆ وڵاتێك بکەیت، ئەوە لە فرۆکەخانەدا ئەفسەری جەوازات داوای پاسەپۆرتەکەت لێدەکات و دەیدات بە فەرمانبەری تایبەت بە تۆمارکردنی پاسەپۆرتەکان لە کۆمپیتەر و دواتر لە دروستی پاسەپۆرتەکەت دەپشکنێت ئینجا بۆتی دەگەڕێنێتەوە و ڕێگەت پێدەدرێت گەشتەکەت بکەیت، بەهەمان شێوە کاتێك دەچیتە ناو خاکی وڵاتەکەی تر هەمان ڕێورەسمت لەگەڵ ئەنجامدەرێت و هەروەها کاتی گەڕانەوشت بۆ وڵاتەکەی خۆت بەهەمان ڕێوشوێندا دەڕویت.

بۆیە دەبێت بزانین پاسەپۆرت چییی؟

پاسەپۆرت بەڵگەنامەیەکی فەرمییە حکومەت دەری دەکات کە تیایدا تەواوی زانیاریەکانی سەبارەت بە کەسایەتی تیایدا دەبێت وەك ناو، ساڵ و ڕۆژی لە دایك بوون، پیشە و ڕەگەزنامە، هەروەها دەرچوونی پاسەپۆرت بۆ کەسێك مانای ئەوەیە حکومەتی وڵاتەکەی ڕەزامەندی خۆی نیشان دەدات لەسەر سەفەر کردی ئەو کەسە بۆ دەرەوەی وڵات.






ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ فرۆکەوانی مەدەنی THE INTERNATIONAL CIVIL AVIATION ORGANIZATION. کە ئاژانسێکە سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانە، چەند تایبەتمەندییەکان بۆ پاسەپۆرت دەرکردە کە دەبێت وڵاتانی جیهان پابەندی بن لە کاتی دەرکردنی پاسەپۆرت، ئەویش بریتیە لەوەی ڕووی دەرەوەی پاسەپۆرت (بەرگەکەی) دەبێت ناوی و هێمای وڵاتەکەی لەسەر بێت و جۆری پاسەپۆرتەکەش دیاری کرابێت (ئاسایی، دبلۆماسی، هتد... )و لاپەڕەی یەکەمی پاسەپۆرتەکەش دەبێت ناو و وێنە و زانیاری و ژمارەی ریزبەندی پاسەپۆرتەکەی لەسەر بێت و لاپەرەکانی تر کە بە بەتاڵی دەمێنەوە بۆ لێدانی مۆری هاتنەناوەوە و چونەدەرە بۆ هەر وڵاتێك بەکاردەهێنرێت. بۆ ڕێگە گرتن لە ساختەکردنی پاسەپۆرت ڕێکخراوی ناوبراو چەند تایبەتمەندییەکی بۆ نووسینی زانیارییەکانی ناو پاسەپۆرتەکە داناوە ئەویش پێویستە زانیارییەکان بە ڕێگەی کۆمپیوتەرەوە تۆماربکرێت ئەوەش ڕێگە دەدات لەکاتی تاقیکردنەوەی دروستی پاسەپۆرت لە فرۆکەخانەکان ئامێرەکانی کۆمپیوتەر تایبەت بە زانیارییەکان بە ئاسانی زانیارییەکانی ناو پاسەپۆرتەکە بدۆزێتەوە و لە ڕاستی پاسەپۆرتەکە دڵنیابێت.



# جۆرەکانی پاسە پۆرت

چەند جۆرێك لە پاسەپۆرت لە جیهاندا هەیە، کە بریتیە لە پاسەپۆرتی ئاسایی کە هەموو هاولاَتیەك دەتوانێت بە دەستی بێنێت هەروەها پێدەگوترێ (پاسەپۆرتی گەشتیاری)، هەروەها پاسەپۆرتی دبلۆماسی کە تایبەتە بە بالیۆز و قونسولەکان، ئەم جۆرەش تایبەتمەندیەك دەبەخشێت بەخاوەنەکانیان وەك ئەوەی مامەلەی تایبەتیان لەگەلّ دەکرێت و جەنتاکانیان لە فرۆکەخانەکان ناپشکنن و بە ئاسانی ڤیزای هەر ولاَتێکیان پێدەبەخشرێت. جۆرێکی تریان پاسەپۆرتێك بۆ کۆمەلّە کەسانێکە کە تەنها یەك جار بەکاردەهێنرێت ئەمەش بۆ ئەو کەسانەیە کە مافی بوونی پاسەپۆرتی تایبەت بەخۆیانەوە نییە وەك مندالاَن لەکاتی سەفەرکردنیان بۆ دەرەوەی ولاَت. هەروەها چەند جۆرێکی تۆپیاسەپۆرت هەیە وەك پاسەپۆرتی خێزانی و، پاسەپۆرتی فریاکەوتن یاخود پاسەڤۆرتی بە پەلە یان کاتی ئەویش بالّیۆزخانەی ولاَتەکەی بۆ ئەو کەسانە دەری دەکات کە پاسەپۆرتەکەیان ونکردوە و بۆ گەرانەوە بۆ ولاَتەکەی بەکاردێت.

## یاسا

سەرەرای ئەوەی پاساپۆرت مەرجێکی سەرەکییە بۆ گەشتکردنی کەسان لە ولاَتەکەیان بۆ ولاَتێکی تر، بەلاَم هەندێ ولاَت هەن رێگە دەدەن هاولاَتیان گەشت بۆ ولاَتەکەیان بکەن بەبێی بەکارهێنانی پاسەپۆرت ئەمەش بەپێی بوونی رێکەوتننامە لە نێوان ئەو ولاَتانە، بۆ نموونە لە نێوان ولاَتانی ئەنجوومەنی کەنداوی عەرەبی، ولاَتانی یەکێتی ئەوروپا، هەروەها گەشتیارانی نێوان ولایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەدا تەنها لە رێگە وشکای و دەریایی و، لەنێوان بەریتانیا و کۆماری ئێرلەندا، هەروەها لەنێوان ولاَتانی ئەمریکای لاتینی و، نێوان سوریا و لوبنان و، کۆمەلّەی ولاَتانی رۆژهەلاَتی ئەفریقیا و، لەنێوان روسیا هەندی ولاَتانی کیشوەری ئاسیا. لەلایەکی ترەوە لە هەندێك ولاَت پێویستە پاسەپۆرت بەکاربێنیت لە کاتی گەشتکردن لە شارێکەوە بۆ شارێکی تری هەمان ولاَت وەك ولاَتی فلبین.






## مێژووی سەرهەڵدانی پاسە پۆرت

بە درێژایی مێژوو چەندین جۆر لە پاسەپۆرت بەکارهاتووە، بۆ یەکەم جار پاسەپۆرت لە کاتی ئیمراتۆریەتی فارسییەوە لە ساڵی ٤٥٠پێش زایینی بەکارهاتووە، هەروەها وڵاتی ئینگلترا لە کاتی دەسەڵاتی شاە هێنری پێنجەم ١٣٨٦-١٤٢٢دا بەکارهاتووە، بەڵام بەکارهێنانی ئەو جۆرە پاسەپۆرتانەی کە زانیاری تەواوی کەسایەتی ئەو کەسەی بەکاردهێنێت لە خۆدەگرێت لە سەرەتای یەکەمی سەدەی بیستەمدا بە کارهاتووە ئەمەش لەبەر سێ هۆی سەرەکی کە ئەمانەن:

یەکەمیان: بەهۆی ئاسانی گەشتکردنی هاوڵاتیان لە نێوان وڵاتانی جیهان بەهۆی بڵاوبوونەوەی بەکارهێنانی شەمەندەفەر بۆ گەشتکردن.

دووەمیان: سەرهەڵدانی جەنگی جیهانی یەکەم ١٩١٤-١٩١٨ئەمەش دوای ئەوەی ئەو وڵاتانەی لە جەنگدابوون ویستیان رێگە بگرن لە دزەکردنی کەسانی جاسوس بۆ ناو وڵاتەکانیان و رێگە گرتن لە کۆچ کردنی زانایانی وڵاتەکانیان بۆ دەرەوەی وڵات.

سێیەمیان: بڵاوبوونەوە و پەرەساندنی وێنەگرتن بە رووناکی.





# کەی بۆ یەکەمین جار مۆم بەکارهێنرا؟!

ئامادەکردنی: حاتەم باتاسی

یەکەمین جار مرۆڤ لە ڕێگەی سووتاندنی دارەوە ڕووناکی دۆزیوەتەوە تیشکی ئەم ئاگرەش بوو شەوانی بۆ ڕووناک دەکردنەوە.

یەکەمین چراش مرۆڤ بەکاری هێنابێت بریتی بووە لە بەردێکی هڵۆڵ یان کەللە سەرێك یان گوێچکە ماسیەك کەپڕی کردووە لە پیوی ئاژەڵ یان ڕۆنی ماسی و فتیلەکەشی بریتی بووە لە قامیشێك یان ریشاڵی ڕووەکێك یان نەیزەیەك..

مۆم مێژووی زۆر کۆنە و لە سەرەتادا لە لولەك سەرەتایی یان کەرەستەی چەوری وشك دروستکراوە و هەڵپێچراوە بە دەوری ریشاڵێکی ڕووەکی یان پارچە قوماشێکدا وەك فتیلە، مۆمەکەش لە مۆمی هەنگوین دروستکراوە، هەر لە زۆر کۆنەوە بەکارهێنراوە. تەنانەت لەماوەیەکی زۆر دوور و درێژدا چاکسازی لەمۆمدا نەکرا، تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، ئەو کاتە دروست کردنی هێشتا لە ئەرکەکانی خانمی ماڵ بوو.

بۆ دەست خستنی مۆم، پیویان لەناو مەنجەڵێکدا دەکوڵاند و دەزووی خوری یان لۆکەیان چەند جارێك دەژەندە لە پیوە کوڵاوەکەداو پاشان هەڵیان دەواسی تا سارد دەبووەوە. کاتێك فتیلە خوریەکە یان لۆکەکە دەگەیشتە ئەستووریەکی دیاریکراو، مۆمەکە ئامادە دەبوو بۆ بەکارهێنان.



دروست کردنی مۆم گەلێ گۆرانکاری بەسەرهات. ئەو مۆمانەی کە لە ماڵاندا دروست دەکران، هێشتا فتیلەکان لە لۆکەو خوری دروست دەکران. بەڵام جگە لە پیوەکە، دەزووەکە لە مۆمی هەنگوین و پارافین و کەرەستەی تر هەڵدەکێشرا.

ئەمرۆ پیوەکە وا چارەسەر کراوە کە زۆرترین ڕووناکی و کەمترین دووکەڵمان بداتێ. لە کۆندا مۆمەکان بە بەردەوامی دووکەڵیان دەردەداو بەهۆی بوونی ماددەی گلسرین لەناو پیوەکەدا بۆنێکی زۆر ناخۆشی دروست دەکرد.

ئێستا گەلێ کەرەستەی نوێ لە دروستکردنی مۆم بەکاردەهێنرێ، بۆ نموونە هەندێ بۆنی خۆش تێکەڵ مۆمەکە دەکەن و بەو جۆرە مۆمانە دەوترێ مۆمی بۆندار. ئەمە جگە لەوەی کە هەندێ مادەی تری تێکەڵ دەکەن تا دوکەڵ نەکات و ماوەیەکی درێژتر مۆمەکە بسووتێ. هەروا ڕەنگی هەمەجۆری تێکەڵ دەکەن تا مۆمەکان شێوەیەکی جوانتریان هەبێت.

# ئایا گیانلەبەران دەتوانن لە یەکتر تێبگەن؟!



ئەگەر واتای پرسیارەکەمان ئەوە بێت، ئایا گیانلەبەران دەتوانن پەیوەندی بەیەکترەوە بکەن بە گواستنەوەی نامەیەکی دیاریکراوەوە بە شێوەیەکی هێما یان دەنگ؟! ئەوا وەڵامەکەمان بەڵێ دەبێت. بەڵام ئەگەر پرسیارەکەمان ئەوەبێت ئایا دەتوانن وەك مرۆڤ لەگەڵ یەکتردا قسە بکەن، ئەوا بێگومان وەڵامەکەی نەخێر دەبێت. تەنانەت لەنێوان مرۆڤەکانیشدا پەیوەندی کردن و لە یەك گەیشتن تەنها بەقسە کردن نییە، ئێمە گوزارشتمان هەیە بۆ روونکردنەوەی هەر مەبەستێك، لەوانەش کاتێك شانمان یان سەرمان دەجوولێنینەوە نیشانەی رازی بوون و رازی نەبوون پیشان دەدەین. یان هەر بەدەستمان جۆرەها هێما پیشان دەدەین. ئاژەڵانیش زۆرجار دەنگ و هێمای تایبەتی خۆیان بۆ هەمان مەبەست بەکار دەهێنن. کاتێك مریشکێك قسقەیەکی بەرز دەکات یان لەسەر زەوی خپ دەکات بەو هێما بێچووەکانی تێدەگەێنێت کە مەترسیەك هەیە. کاتێك ئەسپێك دەحیلێنێت یان سمکۆڵان دەکات ئەوا پەیامەکەی دەگاتە ئەسپەکانی تر. کاتێك باڵندەیەك دەفڕێ لە چلێکەوە بۆ چلێکی تر، دەبینین باڵندەکانی تر بەشوێنیدا نافڕن، بەڵام ئەگەر باڵندەکە بەجۆرێکی تایبەتی هەڵفڕی بەوە باڵندەکانی تر تێ دەگەیەنێت کە بە شوێنیدا هەڵفڕن. سەگەکانیش بە زۆر شێوازی پەیوەندی بەیەکترەوە دەکەن نەك تەنها بە وەڕین، بەڵکو بە مراندن بە حەپە یان بە قاچ بەرزکردنەوە و دان جیڕکردنەوە سەگەکانی تر تێدەگەیەنێت. هەندێك لە گیانلەبەرانی تر بەهۆی بۆنەوە یەکتر تێ دەگەیێنن، زۆربەی ئەو ئاژەڵانەی بە کۆمەڵ دەژین بۆ مانەوە لەگەڵ یەکتردا پشت بە بۆن دەبەستن کە ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت بەبۆنکردن یەکتر و خەڵك و شتەکانی تر دەناسنەوە.

مەیموونیش بە زیرەکترین ئاژەڵ دادەنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ زمانێکی نییە پێی بدوێت بەڵکو بە دەنگ و جولانەوەی دەم و چاوی هەستی خۆی لە مەترسی و برسێتی و تەنانەت دڵخۆشیش دەردەبڕێت. بۆیە ئاژەڵان پێویستیان بە فێربوونی زمان نییە بە پێچەوانەی مرۆڤەوە کە دەبێ قسەکردن فێربێت.

# هاوڕێیانی مشکە

ئامادەکردنی: شنە سەدیق

مشکە: ئەم کاتەتان باش هاوڕێیان، ئەرێ چۆنن؟ لەگەڵ گەرما حاڵتان چۆنە؟ هیوادارم باش بن. هاوڕێیان ئەمە وێنەی هاوڕێ تازەکەمە. ئینجا با بۆتان باس بکەم چۆن یەکترمان ناسی. بە ڕێکەوت ئەم هاوڕێ نوێیەم بینی، کۆوارێکی منی بە دەستەوە بوو دەیخوێندەوە، واتا کۆواری مشکە.

منیش بێدەنگ لە دوورەوە سەیرم دەکرد هەتا تەواو بوو. پاشان وتی کۆوارێکی جوانە! خۆزگە منیش دەبوومە هاوڕێی مشکە و خوێنەرەکانی و وێنەکەم ئاوا لەو کۆوارە جوانەدا بڵاودەکرایەوە، منیش لێی چوومە پێشەوە وتم: ئەمە کارێکی هەر زۆر ئاسانە.

کە سەری بەرز کردەوەو منی بینی، زۆر سەیر بوو بەلایەوە، لەخۆشیدا باوەشی پیداکردم.

منیش ئەم هەلەم قۆستەوەو کەوتمە پرسیارکردن لێی.

- مشکە: ناوت چییە کچە جوانەکە؟
- ناوم هێلینەو تەمەنم یانزە ساڵە.

هێلین کەمێك باسی ژیانی خۆی بۆ کردم. ئەو لەماڵەوە لەگەڵ دایکی و باوکی دەژی و خوشکێکی جوانی هەیە وەکو خۆی. هێلین دەیوت بەیانیان دایکم دەچێت بۆ دەوام و باوکیشم دەچێت بەلای کاری ڕۆژانەی خۆیەوە. تەنها خۆم و خوشکەکەم لەماڵین هەتا دایکم و باوکم دێنەوە بۆ خۆمان بە ئاقڵی لەماڵەوە دەبین، چەندیش بۆمان بکرێ کاری ناوماڵ دەکەین. تا ئەوان دێنەوە دەرگا بۆ کەس ناکەینەوە و ناچینە کۆڵان.

هێلین بەسەر هاتێکی منداڵی خۆی بۆ گێڕامەوە دەیوت لەبیرمە منداڵ بووم زستان بوو، دایکم کتریەك ئاوی گەرم کردبوو بۆ چێشت لێنان. منیش چووم سابوونێکم کردە ناو کتریەکەوە، دوایی دایکم ئاوی کترییەکەی کردە ناو فاسۆلیاکەوە. ئیتر تامی سابوونی دەدا، دیارە کەسیش نەیتوانی شلەیەك بخوات کە تام سابوون بدات.

سەبارەت بە حەز و خولیاکانی، هێلین پێی وتم: حەز و خولیام فێربوونی مۆسیقایە و کەمێکیش دەزانم مۆسیقا بژەنم و لە دوا ڕۆژیش حەز دەکەم ببمە مامۆستای مۆسیقا.

یەکێکی تر لە حەزەکانی هێلین وێنەکێشانە و وێنەی زۆری کێشاوە لە قوتابخانەش هەموو ساڵێك بەشداری کردوە لە پێشەنگاکان.

زۆر حەزی لە وەرزی بەهارە بۆ ئەوەی زیاتر بڕۆن بۆ سەیران و گەشت.

شتێکی تر کە هێلین حەزی لێیە و کردوویەتی بە کاری ڕۆژانەی بەتایبەتی لەم وەرزەی هاویندا خۆشتنە و لە دوای خۆشتنیش دەچێتە بەر ئاوێنەکەی و خەریکی ڕێکخستنی قژیەتی هەتا تەواو بەدڵی خۆی دەبێت.







ئەو کاتەی کە ئەم گفتوگۆیەم لەگەڵ هێلین کرد، دەمەو ئێوارە بوو دایکی هێلین لەماڵ بوو بۆیە هێلین زۆری لێکردم کە پێکەوە بۆ ماڵیان بڕۆینەوە. ڕۆیشتین لەماڵی هێلین شەربەتێکی ساردم خواردەوە بێ ئێوە ناخۆش.

پاشان ئەلبومەکەی پیشاندام کە وێنەی منداڵی خۆی تیابوو، وێنەی هاوڕێکانی تیابوو زۆر جوان بوون.

زۆربەی کەلوپەل و جلەکانی هێلین ڕەنگی پرتەقاڵی بوون، چونکە خۆی حەز بەو ڕەنگە دەکات.

زۆر قسەی خۆشمان کرد، بۆ منیش ئێوارەیەکی خۆشبوو.

من و هێلین ئاگامان لەکات نەما، کاتێ سەیرم کرد خۆر یەك تۆز سەری دیارماوە بۆ ئەوەی ئاوابێت و دونیا تاریک بکات.

بۆیە وتم دەبێ بڕۆم. هەر چەندە هێلین زۆری لێکردم کە ئێوارە لەلای بمێنمەوە، بەڵام دەبوایە بڕۆیشتمایە، چونکە بە دایکمم نەوتبوو.

پێش ئەوەی بڕۆم ماچێکی هێلینم کرد و ماڵئاواییم لێ کرد و هێلینیش سڵاوی هەبوو بۆ هەموو خوێنەرانی مشکە.

# کۆنگرەی مشکان

نووسینی: شەماڵ نەورۆڵی

وێنە : پەروەر

که کۆنگرەی مشکان بەسترا
چەند پێشنیار،
پێشکەش کرا
لە ناویاندا یەکێك گوتی:
بۆ ئەوەی مشکانی جیهان
بکەونە تیلی لی لی
چەند خۆشە گەر
چی پشیلەی جیهان هەیە
زەنگوڵە بکەنە ملی!



# کەشتی

نووسینی : زارا ئەحمەد
وێنە : گەیلان عەبدوڵڵا

لەنێو کەشتی ژیانین
وەکو پەپوولە جوانین
دێینو دەچین لەسەر ئاو
بە باران و بە هەتاو
لە قوڵایی دەریاکان
میوانی شەپۆڵەکان
لەگەڵا باڵدار و ماسی
لە ئاودا یەکمان ناسی
بوینە هاورێی ئاسمان
هەمیشە واین لە سەیران



ئامادەکردنی: ڕێواس ئەحمەد

# گەشتەکەی مشکە و دمبۆ بۆ قوتابخانەیەک

## نامەی مشکە بۆ خوێنەران



ئێوارەبوو، خۆر هێندەی نەمابوو ئاوابێت.
مشکە لە باڵکۆنی هوتێلەکە دانیشتبوو، دیاربوو بیری لە شتێك دەکردەوە. دمبۆش ماوەیەکی هێندە زۆرە لەگەڵ مشکەدا دەژی بۆیە یەکسەر لێی تێدەگات. بە هیواشی چووە لایەوەو پرسی:
- ها مشکەی هاوڕێم! ئەوە بیر لەچی دەکەیتەوە؟
- بیر لە منداڵانی کوردستان دەکەمەوە، دەزانی ئێستا قوتابخانە کراوەتەوەو هەموو هاوڕێکانم دەستیان بە خوێندن کردووەتەوە.
ئەم هەموو کاتە من لێرەم و کەچی سەردانی هیچ قوتابخانەیەکم نەکردووە.
- لەوە ئاسانتر هەیە، هەر ئێستا دەچین بۆ قوتابخانەیەك.
منیش زۆربەی هاوڕێکانم دەستیان بە خوێندن کردووەتەوە.



- زۆر چاکە، بەس دەبێت وەرقەو قەڵەم لەگەڵ خۆم بهێنم تا هەموو زانیارییەکان بنووسمەوە، تا لەبیرم نەچێت و هەموویان بۆ باسبکەم.
هاوڕێیانم چیتان بۆ باسبکەم.
ئەو قوتابخانەیەی کە لەگەڵ دمبۆی هاوڕێم سەردانمان کرد هەر زۆر گەورەبوو.
نزیکەی حەوت سەد قوتابی لێی دەخوێند، لە پۆلی یەکەمەوە تا پۆلی نۆ.
ئەم قوتابخانەیە لەیەکێ لە گەڕەکەکانی شاری ستۆکهۆڵمە.
لەم قوتابخانەیەدا چێشتخانەیەکی لێیە کە نیوەڕوان خواردن بۆ هەموو قوتابیان و مامۆستاکان ئامادە دەکات.
واتە قوتابی هەموو نیوەڕۆیەك لە نێوان کاتژمێر دەونیو تادوانزەو نیو نانی نیوەڕۆ دەخۆن.
نیوسەعات پشوویان هەیە و دەستدەکەنەوە بە خوێندن.
چەند لە پۆلی بەرزتربن درەنگتر تەواودەبن.
واتە ئەوانەی لە پۆلی نۆن زیاتر دەرسیان هەیەو تا دەرنگانێ دەمێننەوە.
ئەوانەی پۆلی یەك و دوو و سێن تا سەعات یەك دەخوێنن.





پاش ئەوەی دەرسەکانیان تەواو دەبێت دەچن بۆ شوێنێکی تر کە هەر سەر بە قوتابخانەکەیە.
لەوێ خەریکی یاری و گورجوگۆڵی هەمە ڕەنگ دەبن تا دایك و باوکیان دێن بە شوێنیاندا.
دیارە خۆیان بە تەنیا نین بەڵکو چەند کەسێکی گەورەیان لەگەڵدایە تا ئاگاداریان بن و بەرنامەیان بۆ دابنێن.
هەروا لەوێ کتێبخانەیەکی گەورەی لێیە کە قوتابیان دەتوانن کتێب بە قەرز وەرگرن.
هەر لەو قوتابخانەیەدا چەند تاقیگەی گەورەی فیزیاو کیمیاو زیندەوەرزانی لێیە. شوێنی دروومان، وێنەکێشان و دارتاشی لێیە، هەموو قوتابیان دەبێت فێری ئەو شتانە بن. هەروا وانەی ئابووری ماڵداریشیان هەیە، کە قوتابیان فێری نەك تەنیا خواردن دروستکردن دەکات بەڵکو فێری چونیەتی بەڕێوەبردنی ئابووری ماڵ و خواردن دەکات.
هەروا هۆڵێکی زۆر گەورەی لێیە بۆ وەرزش کردن و هەموو جۆرەکانی پێداویستی وەرزشی لێیە.
ئەمە جگە لە ژووری مۆسیقا، لەویش زۆر ئامێری مۆسیقام بینی.
لەم دەرسەدا منداڵان فێری گۆرانی و ژەندنی ئامێرێکی مۆسیقا دەبن. هەر زۆر سەرم سوڕما و گێژبووم.

بەتایبەتی کە چوومە پۆلەکانەوە. زۆر گەورەو خۆش بوون.
کەرەستەی فێربوونی لێ بوو. قوتابیانی پۆلی سێ خەریکی تەماشاکردنی ئەو دەنکە فاسۆلیایە بوون کە هەریەکە ناشتبووی.
هەموو رۆژی ئاویان دەدەن و سەیریان دەکەن تا بزانن چۆن گۆڕاون. قوتابیان پۆلی دوو، هەریەکە سەیری گەرای پەپوولەیان دەکرد و چاوەڕوانی ئەو گۆڕانکارییەیان دەکرد کە ڕۆژانە ڕوودەدات و تا دەبنە پەپوولەیەك پاشان دەیانبەن لە حەوشەی قوتابخانەکەدا بەرەڵایان دەکەن و ئەوانیش دەفڕن و ئاسمانی قوتابخانەکەدا دەبێت بە پەپوولەی ڕەنگاوڕەنگ.
ئەی ئەو هەموو کۆمپیوتەرە هەر باس ناکرێ.
قوتابیانی پۆلی شەش تا نۆ هەر یەکە کۆمپیوتەری خۆی هەیە.
ئۆی هاوڕێیان ئەوەندە شت زۆر بۆتانی باس بکەم، مەگەر کە هاتمەوە، ئێستا منیش و ئێوەش ماندوو بووین.



# کتێبخانەی مشکە

**ئامادەکردنی: مشکە**
**سکێچ: شێروان موحسین**
**ڕەنگ: گەیلان عەبدوڵڵا**



لە کتێبخانەی مشکە هەر جارە و باسی کتێبێکتان بۆ دەکەین، بۆ ئەوەی ئێوەش بتوانن، ئەو کتێبەتان دەست بکەوێت و بیخوێننەوە.

**ناوی کتێب: کوڕی ناو دارستان**
**وەرگێڕانی لە فارسییەوە: ئاوات ڕەحیمی**
**نیگار: ڕامین**
**بابەت: چیرۆك**




منداڵە خۆشەویستەکان ئەمجارە کتێبخانەی مشکە کتێبێکی بۆ ئامادە کردوون بەناوی (کوڕی ناو دارستان).
کە ئەم کتێبە باس لە کوڕێك دەکات لە دارستارنەکانی هیندستان لەگەڵ پڵینگێکی ڕەش و کۆمەڵێك گورگ دەژی، جا لەو دارستان شێرێك ڕقی لێیە چونکە وا دەزانێ دەبێتە گەورەترین ڕاوچی بۆ گیانی ئەو، جا منداڵە خۆشەویستەکان لێرەوە بۆ ئێوەی خۆشەویست جێدەهێڵم.
کتێبەکە قەبارە مام ناوەندییە لە بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیرییە.



# گەلەریی مشکە







بەسۆز سەدیق
پۆلی شەشەمی سەرەتایی
قوتابخانەی بزاڤی بنەڕەتی





ئەحمەد ئیسماعیل
پۆلی شەشەمی سەرەتایی
قوتابخانەی بزاڤی بنەڕەتی





عیسا جەردیس
پۆلی شەشەمی سەرەتایی
قوتابخانەی بزاڤی بنەڕەتی





روقیە لوقمان
پۆلی شەشەمی سەرەتایی
قوتابخانەی بزاڤی بنەڕەتی



# پشووی مشکە

مندالاَنی ئازیز وەرن با بەیەکەوە ئەم وێنەیە بە چەند قۆناغێك دروست بکەین و لەپاشان بەو شێوەی کە ئامادە کراوە رەنگی بکەین.



1



2



3



4

# باران بارین

**نووسینی: هاشم خۆرانی**

باران بارین منداڵان
بەخشینێکی خودایە
بۆتە سەرچاوەی ژیان
لەکۆنەوە هەروایە
بەتیشکی خۆر لە زەریا
هەڵم لە ئاو هەڵدەستێ
دەبێتە هەوری ئاسمان
هەر دەڕوات و ناوەستێ
کە گەیشتە بای سارد
دەیکاتە بەفر و باران
دەبارێتە سەر زەوی و
باخ و کێڵگە و دارستان
تێر تێر پاراوی دەکا
کشتوکاڵی جوتیاران
خەڵك دڵی خۆش دەبێ
لەگەڵا چینی هەژاران

دەبێتە ساڵێکی خۆش
سروشت دەبوژێتەوە
وەرزی بەهار سەوز و جوان
هەموو دەرازێتەوە
ئاوی کانی و قەڵبەزە
دەڕۆن بە شڵپە و هاژە
مەلەکانیش بە ئاواز
دەکەونە گەڕلاوژە
باعەی بەرخ و کارژیلە
لەگەڵ ئاوازی بلوێر
زایەڵەیان دێتە گوێ
لە دەشت و دەرو زەنوێر
خەڵك دەستە بەدەستە
دەڕژێنە دەشت و لاپاڵ
سەیران گەشتێکی خۆشە
بۆ گەورە و بۆ منداڵان

